فردريك ئەنگڵس

# رۆڵی کارکردن
## لە گۆڕینی مەیموون بۆ مرۆڤ

وەرگێڕانی لە ئەڵمانییەوە
کەریم مەلا رەشید

فردريك ئەنگڵس

رۆڵی کارکردن لە گۆڕینی
مەیمون بۆ مرۆڤ

وەرگێڕانی لە ئەڵمانییەوە
کەریم مەلا رەشید



تێبینی:
ئەم کتێبە لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان
وەزارەتی رۆشنبیری \ سلێمانی ، بڵاوکراوەتەوە

زنجیرە: 119
تیراژ: 1500
ژمارەی (718) ی وەزارەتی رۆشنبیری سلێمانی پێدراوە

## پێشەکی وەرگێڕانی کوردیی

**پاش ئەوەی کتێبی (بنەچەی خێزان و خاوەندارێتی تایبەت و دەوڵەت / نووسینی فردریك ئەنگڵس)م وەرگێڕایە سەر زمانی کوردی، بەپێویستم زانی کە ئەو زانیاریانەی لەبارەی وەرگێڕانی ئەم جۆرە کتێبانە کۆمکردۆتەوە، بەرهەمی دیکەشی پیٚ وەربگێڕم، بۆیە دەستم دایە ئەم کتێبە، کە وێڕای ئەوەی قەوارەکەی بچووکە بەڵام لە رووی زانستییەوە هەر وەکو کتێبەکەی تر، زۆر گرنگ و پڕبایەخە چونکە سەردەمێکی زۆر تاریك لە مێژووی مرۆڤایەتی رووندەکاتەوە. ئەم نووسراوەی ئەنگڵس تۆژینەوەیەکی زانستییە لەبارەی چۆنێتی دروستبوونی مرۆڤ و گەیشتنی بەم ئاستەی ئێستا چ لە رووی پەرەسەندنی مێشك و چ لەرووی ئەو گۆڕانکارییانەی کە بەسەر چەستەیدا هاتوون. هەر وەك لە پەراوێزی ئەم تۆژینەوەیشدا ئاماژەی بۆکراوە، ئەم لێکۆڵینەوەیەی ئەنگڵس لەکاتی خۆیدا وەکو پێشەکییەك بۆ کتێبێکی مەزن، بە ناوی (دەربارەی هەر سیٚ شێوە بنەڕەتییەکەی کۆیلەتی) نووسیوە، بەڵام کارەکەی بە تەواونەکراوی مایەوە. سەرئەنجام ئەنگڵس ئەو پێشەکییەی ناو نا (رۆڵی کارکردن لە گۆڕینی مەیمون بۆ مرۆڤ) کە بەشی هەرە زۆری دەستنووسەکەی گرتبۆوە.**

**هەر وەکو کارەکەی پێشووم بەپێی توانا، هەوڵمداوە بۆچوونەکانی ئەنگڵس بە کوردییەکی سادە و ئاسان داڕێژم بۆ ئەوەی زۆرترین توێژی کۆمەڵایەتی کوردەواری لێی تێبگەن. هیوادارم ئەم کارەشم خشتۆکەیەك لە بینای بەرهەمی زانستی و هۆشیاری کورد زیاتر بکات.**

**کەریم مەلارەشید**
**هانۆڤەر - ئەڵمانیا**

کار، وەك زانایانی ئابووریی ڕامیاری دەڵێن، سەرچاوەی هەموو سەروەت و سامانێکە، جا لەتەك سروشتدا ئەو وەهایە، چونکە سروشت ئەو کەرەستانەی بۆ دابین دەکات کە دەیانکات بە سامان. بەڵام کار بەبێ سنوور هێشتا زۆر لەوەش زیاترە, چونکە یەکەمین بناغە و هیمی سەرجەم ژیانی مرۆڤایەتی پێکدەهێنێت، بە ئەندازەیەکی وەها کە ئێمە بە دڵنیاییەوە بڵێین: خودی مرۆڤیش دەستکردی کارە.

پێش سەدان هەزار ساڵ، لە سەردەمێکی چاخەکانی زەویدا. کە هێشتا ناتوانرێ کاتەکەی دەسنیشان بکرێت، جیولۆجییەکان چاخی سێهەمی پێ دەڵێن، لەوانەیە لە کۆتاییەکەی دابێت، لە ناوچەیەکی گەرمی زەوی. لە جێگایەکدا – لە ئاقارێکی پان و بەریندا بووبێت، کە ئێستا ئاوی ئۆقیانووسی هیندی دایپۆشیوە – توخمە مەیمونێك دەژیان کە بەرەگەز لە مرۆڤ دەچوون و بە پلەیەکی زۆر باڵای پەرەسەندن ڕاگەیشتبوون و پێشینانی ئێمە پێك دەهێنن، داروین کەم تا زۆر باسی لەم مەیمونانە کردووە. ئەوانە جەستەیان سەرانسەر بە تووك داپۆشرابوو، تیسکن بوون و سەری گوێکانیان قوت بوو. بە گەلە لەسەر دارەکان دەژیان (1).

لەژێر کاریگەریی شێوازی ژیانیان، وەها پێویست بوو کە لەکاتی هەڵگژاندا، دەست بۆ کارێکی جیاواز لە کاری پێ، خۆیان تەرخان بکەن، ئەم مەیمونانە لە کاتی ڕۆیشتن بەسەر زەوییەکی تەختدا، خەریکبوون، بە بێ یارمەتی دەست بەڕێگادا بڕۆن و جار لە جار زیاتر لە ڕۆیشتندا قیت دەبوونەوە. بەم جۆرە **هەنگاوی یەکلاکەرەوە نرا**، **بۆ تێپەڕبوونی مەیمون بەرەو مرۆڤ***

* جەختکراوەکان هی ئەنگڵسن ( وەرگێڕی کوردی)

هەموو ئەو مەیمونانەی کە چوون مرۆڤن و ئێستاش هەن، دەتوانن ڕێك بەسەر هەردوو پێیەکانیاندا بەبێ داکۆکی دەستەکانیان قیت بوەستن و بەرەوپێش بڕۆن، بەڵام تەنها لەکاتی تەنگانە و پێویستیدا ئەمە دەکەن. ئەو مەیموونانە بە شێوەکی سروشتیی کووڕ دەڕۆن و سەرئەنجام، پێویستییان بە بەکارهێنانی دەستەکانیشیانە. زۆربەی هەرە زۆری ئەم مەیموونانە لە کاتی ڕۆیشتنیاندا، ناولەپیان لە زەوی، بە قوچاویی دادەنێن جەستە و پێیەکانیان بەدوای خۆیاندا بە نێو قۆڵ و باسکە درێژەکانیاندا رادەکێشن، هەر وەکوو گۆجێك کە بە جووتێك دارشەق بڕوات. ئێمە بە گشتی ئێستاشی لەگەڵدا بێت، دەتوانین قۆناغەکانی تێپەڕبوون بەدی بکەین، کە تێدا ئەو مەیموونانە, شێوازی ڕۆیشتنیان بەسەر چوارپەل گۆڕا بۆ دوو. بەڵام ئەم جۆرە ڕۆیشتنەیان، تەنها بۆ کاتی فریاکەوتن رووی دەدا.

ئەگەر بە قیتیی ڕۆیشتن لەلای پێشینە توکدارەکان لە سەرەتادا وەك خوویەك بووبێت و پاشان لەگەڵ ڕۆژگاردا وەکو پێداویستیی خۆی سەپاندبێت، ئەوا ئەمە, جەخت لەسەر ئەو پێشبینییە دەکاتەوە کە دەست، جار لە دوای جار زیاتر بە کاری دیکەی زۆر جیاواز لە هی پێ هەڵدەستا. تەنانەت لە مەیموونیشدا دابەشبوونێکی ئاشکرا لە نێوان بەکارهێنانی دەست و پێدا هەیە. دەست، هەر وەکوو گوتمان، لەکاتی هەڵگژاندا بە کارێکی جیا لە هی پێ هەڵدەستێ و بەشێوەیەکی تایبەت بۆ ڕنین و گرتنی خواردن بەکاردێت، هەر وەك چۆن گیاندارە شیردەرەکان، ئەوانەی کە لە پلەیەکی نزمدان، بە ناولەپی دەستیان ئەو کارانە دەکەن. هەندێك مەیموون بۆ دروستکردنی لانەکانیان لە نێو دارەکان دەستیان بەکاردەهێنن، یا هەر وەکو مەیموونی شیمپانزی کە لە نێو لقی دارەکاندا بۆ خۆپاراستن لە کەشوهەوا، سابات دروست دەکات. هەروەها بە دەست و کوتەك، خۆی لە نەیاران دەپارێزێ و بەرد و بەری داریان پێ

تێدەگرێت. هەروەها لە باخچەی گیانەوەران لە قەفەسەکاندا، لاسایی مرۆڤ دەکاتەوە و دەستەکانی وەکو دەستی ئەو و شتە ئاسانەکانی چاو لێدەکا، بەڵام ئا ئەلێرەدا، هەموو جیاوازییەکان لە نێوان دەستی پەرەنەگرتووی ئەو مەیموونانەی کە لە مرۆڤ دەچن، تەنانەت ئەوانەش کە زۆر لێی دەچن، لەگەڵ دەستی مرۆڤدا کە بەهۆی کارکردنەوە راهێنراون و پەرەیان سەندووە، ئەو دەستانەی کە بەهۆی کارکردنەوە بە درێژایی هەزاران سەدە، تا ئەوپەڕەکەی بە رێکی و بە لەباری راهاتوون. ژمارە و چۆنیەتیی دامەزراندنی ئێسك و ماسوولکەکان بە شێوەیەکی گشتی، لە دەستیمرۆڤ و لە هی مەیموونەدا چوون یەکن، بەڵام دەستی مرۆڤی نزمترین ئاست و قۆناغی دڕندەیی، دەتوانێت سەدان شت جێبەجێ بکات، کە دەستی هیچ مەیموونێك ناتوانێت چاویان لێ بکات. دەستی هیچ مەیموونێك هەرگیز نەیتوانیوە سادەترین چەقۆی بەردین دروست بکات.

ئەو کارانەی کە لە ماوەی هەزاران ساڵدا، پێشینانمان لە قۆناغی گوێزانەوە لە مەیموونەوە بۆ مرۆڤ، پلە بە پلە دەستەکانیان بۆ گونجاندووە، لە پێشدا زۆر سووك و سانا بوونە. نزمترین گیانداری کێویی، تەنانەت ئەوانەی کە زیاتر لە دۆخی گیانەوەرانەوە نزیك بوون و هاوکات جەستەشیانی بۆ گونجا بوو، لە پلەیەکدا بوون، زۆر لە هی ئەم بوونەوەرانەی قۆناغی ناوەندی باڵاتر بوونە.

تا دەستی مرۆڤ بەردێکی کردووە بە چەقۆ، ئەوەندەی کات و رۆژگار خواستووە، کە لە بەرامبەریدا ئەو قۆناغە مێژووییەی ئێمەی مرۆڤ درکی پێدەکەین، زۆر ناچیز و کەمە. بەڵام هەنگاوی یەکلاکەرەوە نرا: **دەستەکانی مرۆڤ ئازاد بوون** و ئێستا دەتوانن بەردەوام کاری نوێی کارامە و دانسقە جێبەجێ بکەن، بەم جۆرە ئەم توانا بۆماوەیە و هەمیشە پەرەگرتووە، نەوە پاش نەوە، بەجێ دەما و دەگوێزرایەوە.

کەواتە دەست نەك هەر ئامرازی کارکردنە، بەڵکوو **بۆخۆشی لە بەرهەمەکانی کارە**. تەنها بەڕێگای کارکردن(3)، لە دووتوێی خۆگونجاندن لەگەڵ بەردەوام بەدی هێنانی نوێدا، لە دووتوێی بۆمانەوەی دەستکەوتە تایبەتییەکانی پەرەئەستاندنی ماسوولکە راهێنراوەکان و لە ماوەیەکی دوورودرێژتری پەرەئەستاندنی ئێسکەکانیشدا بەم شێوەیەی ئێستا، هەروەها لە دووتوێی هەردەم روولەنوێی بەکارهێنانی ئەم ووردەکارییە بە میرات بۆماوەییە و بەردەوام نوێکردنەوەی لە کۆتاییدا، پلەیەکی زۆر باڵای بێ کەموکوڕی بە دەستی مرۆڤ گەیاند، کە بتوانێت تابلۆکانی رافائیل و پەیکەرەکانی تۆرڤالدسن و موزیکی پاگانین ، چوون تەلیسمێك وەبەرهەم بهێنێ.

بەڵام دەستەکان بەتەنها نەبوون. بەڵکوو تەنها یەك ئەندامی ئۆرگانێکی باڵای پێکەوەگرێدراو بوون. جا ئەوەی لە بەرژەوەندی دەستەکاندا بوو، لە بەرژەوەندی هەموو ئەندامانی جەستەدا بوو، کە ئەوان کاریان بۆ دەکرد بەڵام بە دووچەندانە.

یەکەمین سەرئەنجام، وەك داروین ناوی لێنا، یاسای پێکەوە گرێدانی گەشەکردن بوو. بە پێی ئەم یاسایە، شێوە تایبەتییەکانی هەر بەشێکی ئۆرگانی لە بوونەوەرێکدا بەردەوام بە شێوەیەکی تایبەتیی بە بەشێکی دیکەوە گرێی خواردووە، بەبێ ئەوەی کە بەڕواڵەت هیچ پەیوەندییەکیان پێکەوە هەبێت. بەم جۆرە سەرجەم گیانداران، ئەوانەی کە خوێنەکانیان خڕۆکەی سووری بێ ناوکی

---

† رافائیل سانتی (1438–1520) – نیگارکێشێکی مەزنی ئیتالییە، لە سەردەمی راپەریندا.

‡ تۆرڤالدسن، برتال (1768–1844) – پەیکەرتاشێکی ناوداری دانیمارکییە.

§ پاگانین، نیکۆلۆ(1782–1840) – کەمانجە ژەن و ئاوازسازێکی مەزنی ئیتالییە.

تێدایە و پشتی سەریان بە هۆی جووتە جەمسەرێکەوە بە بڕبڕەی یەکەمی بڕبڕەکانی پشتەوە بەستراوە، ئەوانە هەر هەموویان، بەبێ چەندوچوون، لووی شیریان، بۆ ژەمەشیری بێچووەکانیان، هەیە. هەروەها لەنێو شیردەرەکاندا، فرەسمەکان هاوڕێك لەگەڵ ئاڵۆزبوونی گەدەیاندا، کە بۆ کاوێژکردن بگونجێت، سمەکانیان دێنەوە یەك. هەمواری گۆڕانکارییەکان لە شێوە تایبەتیەکانی جەستەدا، بەدوای خۆیاندا گۆڕانکارییەکانی دیکەی جەستە رادەکێشن، بەبێ ئەوەی ئێمە بتوانین پەیوەندییان روون بکەینەوە. ئەو پشیلانەی کە زۆر سپین و چاوەکانیان شینن، کەم تا زۆر، کەڕن. هەمواربوونی پلە بە پلەی دەستی مرۆڤ، بەو وردییە، لەگەڵ راهێنان و پەرەئەستاندنی پێ بۆ بەقیتی رۆیشتن، بە هۆی ئەم پەیوەندییەوە، گومانی تێدا نییە، کاردانەوەی لەسەر بەشەکانی دیکەی سەرجەم ئۆرگانیزم هەبوو. فراوانی لێکۆڵینەوە لەم کارلێکەیە هێشتا زۆر تێروتەسەل نییە و زۆر کەمە، بۆیە لێرەدا دەبێ تەنها بەشێوەیەکی گشتیی ئاماژەی بۆ بکەین.

لەوە گرنگتر، کاردانەوەی راستەوخۆی پەرەئەستاندنی دەستە بەسەر ئۆرگانەکانی تردا کە دەشێت بسەلمێندرێت. وەك لەپێشدا گوتمان، نیمچە مەیموونەکان کە پێشینانمانن، کۆمەڵایەتی بوون، روون و رەوایە، مەحاڵە بتوانین بڵێین، مرۆڤ، کە کۆمەڵایەتیترین سەرجەمی گیاندارانە، لە پێشینەیەکەوە سەرچاوەی گرتووە، کە نا کۆمەڵایەتی بووبن. راهێنانی دەست بۆ کارکردن، بوو بە سەرەتای زاڵبوون بەسەر سروشتدا و لەگەڵ هەر پێشکەوتنێکی نوێدا ئاسۆی بیرکردنەوەی مرۆڤی ئاوەڵا و فراوانتر دەکردەوە. بە بەردەوامی خەسڵەتی نوێی لە دووتوێی کەرەستەکانی سروشتدا دەدۆزێیەوە کە لەپێشدا پەی پێ نەبردبوون. لە روویەکی ترەوە راهێنان لەسەر کارکردن بە بەناچاریی رۆڵی خۆی هەبوو لە پتەوکردنی جار لە جار زیاتری پەیوەندییەکانی نێو کۆمەڵگادا، ئەویش بەرامبەر بەوە پارێزگاریی لەو دۆخانە دەکرد کە بە سوود و بەهای کارلێکردنی ئەو هاوکارییە روو لەزیادەی بۆ هەموو کەسێك ئاشکرا دەکرد و بەوە هوشیاری دەکردەوە. بە کورتی ئەوانەی بەرەو بوون بە مرۆڤ نەشونمایان دەکرد **پێداویستی** ئەوە لە نێویاندا گەڵاڵە بوو، کە دەبوو **شتێك** بە یەکدی **بڵێن**. ئەو پێداویستیەش بۆ خۆی ئۆرگانێکی هێنایە کایەوە. گەرووی پەرەنەگرتووی مەیموون بەهۆی ئاوازی دەنگەوە گۆڕانی بەسەرداهات، گۆڕانێکی بە کاوەخۆ بەڵام جەخت کراو، لە پێناو خۆگونجاندن بۆ ئاوازێکی سەروم پەرەگرتوو، ئۆرگانەکانی دەم بەرەبەرە فێری ئەوە بوون دەنگێکی روون، دوا بە دوای یەك، دەربهێنن، بۆ ئەوەی بێنە گۆکردن.

بەراووردکردنێك لەگەڵ گیانداراندا، بە بەڵگەوە دەیسەلمێنێ، کە ئەم روونکردنەوەیە بۆ سەرهەڵدانی قسەکردن کە لە کارکردنەوە سەرچاوەی گرتووە و یاوەری بووە، تاکە روونکردنەوەیە، کە راست و دروست بێت، چونکە ئەوەی کە گیانداران، تەنانەت ئەوانەی کە زۆریش پێشکەوتوون، دەیانەوێت بە یەکتری رابگەیێنن، یەکجار کەمن و دەتوانن بەبێ قسەش، بەبێ وتەیەکی روون، واتە، بەبێ گۆکردن، بیگەیەنن. لە سروشتدا هیچ گیانەوەرێك نییە لەبەر قسەنەکردنی یا لەبەرئەوەی کە لە زمانی مرۆڤ ناگات، هەست بە ناتەواوی بکات، جا ئەمە بەتەواوی پێچەوانە دەبێتەوە ئەگەر مرۆڤ بەخێویان بکات. سەگ و ماین لە هەڵسوکەوتیان لە گەڵ مرۆڤدا گوێیان زۆر چاك بە قسەکانی ئاشنا بووە، تەنانەت لە سنووری تێگەیشتنیاندا دەتوانن زۆر بە ئاسانی فێری هەموو زمانێك ببن. وێڕای ئەوەش توانای هەستکردنیان تێدا پەیدا بووە، وەکوماڵیی بوون و هەستی چاکەکردنی مرۆڤ لەگەڵیاندا و هتد... واتە هەست و نەستێك کە لە پێشدا بۆیان نامۆ بوو. ئەوەی کە بە زۆریی لەگەڵ ئەم دوو گیاندارەدا هەڵسوکەوتی کردووە، ئەستەمە نەچێتە ژێر باری ئەوەی کە شتی وەهای لەم

دوو گیانداره بەدی کردووە، کە **ئێستا** بە قسەنەکردنیان هەست بەناتەواوی بکەن، ئەو کەموکوڕییەی کە مەحاڵە بتوانرێت چارەسەر بکرێت، چونکە بەداخەوە کۆئەندامی تایبەت بە ئۆرگانی دەنگیان، چیتر بە هانایانەوە نایەت. بەڵام ئەگەر ئۆرگانی تایبەتمەند هەبوایە، ئەوا لە سنوورێکی تایبەتیدا، ئەم توانای قسەنەکردنەش لەناودەچوو. ئۆرگانەکانی دەم لەلای باڵندەکان بەدڵنیاییی لەگەڵ هی مرۆڤدا جیاوازن، سەرەڕای ئەوەش باڵندەکان تەنها گیاندارن کە فێری قسە دەبن، تەنانەت ئەو باڵندەیەی  دەنگی لە هەموان نەشازترە، کە توتی‌یە، لە هەموان چاکتر دێتە قسە، کەس ناڵێت ئەو لە قسەکانی خۆی ناگات. بەڵام ئەو بەخۆشحاڵییەوە دەدوێت و لە ناو ئاوەدانیدا چەندین سات هەموو گەنجینەی وشەکانی هەڵدەڕێژێ و بەبێ وەستان دووبارەیان دەکاتەوە. بەڵام ئەو بە ئەندازەی بازنەی تێگەیشتنی خۆی توانای ئەوەی هەیە لەو شتانە بگات کە دەیانڵێتەوە. کەسێك کە پەپاگایەك فێری جنێو دەکات، بەجۆرێك کە ئەو لە ماناکەی بگات (ئەوەش یەکێکە لەو یارییە باوانەی ئەو کەشتیوانەی کە لە وڵاتە گەرمەکانەوە دەگەرێنەوە، کە یەکێك دەیوروژێنێ یا بە خواردنێکی خۆش رازی دەکا،  یەکسەر بۆی دەردەکەوێت کە ئەو، زۆر بە چاکی هیچ جنێوێك بە فیڕۆ نەدات و هەمویان بڵێتەوە، بەهەمان شێوەی ژنە سەوزەفرۆشەکانی بەرلین کە جنێوەکان دەدەن.

لە سەرەتادا کارکردن، پاشان و لەهەمان کاتیشدا قسەکردن– ئەمانە دوو هاندەری بنەڕەتیین کە بەهۆیانەوە مێشکی مەیموون لە هەموو ڕوویەکێەوە و بێ کەم وکوڕیی بەرە بەرە رووەو مێشکی مرۆڤ هەنگاوی نا. هاوشان لەگەڵ پێگەیشتنی مێشکدا ئامرازەکانی پاش خۆی پێگەیشتن، واتە ئۆرگانەکانی هەستکردن. هەروەك چۆن قسەکردن لە پلە بە پلەی پەرەسەندنیدا، هەموو وردەکارییەکانی لەگەڵ خویدا هێنا کە بۆ پەرەئەستاندنی کۆئەندامی بیستن پێویستن، بە هەمان شێوەش بەهۆی پەرەئەستاندنی مێشکەوە هەرگیز هەموو ئەندامە هەستیارەکان پەرەیان دەستاند و پێگەیشتن. مەودای بینینی داڵ لەچاو هی مرۆڤ زۆر زیاترە، بەڵام چاوی مرۆڤ لە پێکهاتەی شتەکاندا شتی زۆر زیاتر بەدی دەکات. توانای بۆنکردنی سەگ لەچاو هی مرۆڤ گەلێك زیاترە بەڵام ئەو یەك لە سەدی ئەو بۆنانەی کە بۆ مرۆڤ نیشانەی بەڵگەنەویستن بۆ شتی جیاجیا، سەگ لێکیان جیا ناکاتەوە. هەستی بەرکەوتن، کە بەوپەڕی سادەیی و درشتی و بەدەگمەن لەلای مەیموون هەیە، تەنها بەهۆی کارکردنەوە، لە خودی دەستی مرۆڤدا هاتەکایەوە.

پەرەئەستاندنی مێشك و کۆئەندامی هەست کە لە خزمەتیدان، روونبوونەوەی روو لەزیادی درك پێکردن، چاکتربوونی توانست بۆ داماڵین و هەمەکیی کردن– ئەمانە هەموو کاریان کردە سەر کارکردن و گۆکردن، بەوەی کە بوونە هاندەر و تەزووی هەمیشە نوێ بۆئەوەی لە پەرەئەستاندنێکی هەمیشەیی دابن. ئەم پەرەسەندنەش پاش جیابوونەوەی تەواوی مرۆڤ لە مەیموون کۆتایی پێ نەهات، بەڵکوو بە پێچەوانەوە، لەو کاتەوە دەستیپێکرد. چەندین قۆناغی بەرەوپێشەوەی بڕی، قۆناغی ئەوتۆ کە مەودا و رووکاری جیاوازیان هەبوو، بەپێی جیاوازی میللەتان و جیاوازی ئاست و پلەی پێگەیشتن، جاروباریش بە پێی ناوچە و کات خۆبەخۆ نسکۆی دەهێنا، بە گشتی بەرەو پێشەوە هەنگاوی چەسپاویان دەهاویشت، تاوێك تەکانێکی بەهێزی پێ دەدرا و گاوێکیش بەلایەکی دیاریکراودا، لەلایەن توخمێکەوە کە لەگەڵ مرۆڤی بێ کەموکوڕدا هاتەکایەوە، ئاراستە دەکرا، ئەو توخمە نوێیەش – **کۆمەڵگایە**.

سەدان هەزارساڵ تێپەڕین —بەسەر مێژووی زەوی کە لە ژیانی مرۆڤدا لە چرکەیەك تێناپەڕێت** — پێش ئەوەی لەو گەلە مەیموونانەی کە بە دارەکاندا هەڵدەگژان، کۆمەڵە مرۆڤێك پەیدا ببن، بەڵام سەرئەنجام هەر پەیدابوون. جا ئێمە جارێکی تر بە چ شەقڵێکی جیاکەرەوە ئەو گەلە مەیمونە لە کۆمەڵگای مرۆڤ جویێ دەکەینەوە؟ بە کارکردن.

گەلە مەیمونەکان خۆراکی سنوری ناوچەکەی خۆیان دەڕنییەوە، ئەو سنورەش بارودۆخی جوگرافی یا ململانێکردن لەگەڵ گەلە مەیمونەکانی دیکە پانتاییەکەی بۆ دابین دەکردن. لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی دی بەدوای لەوەڕدا عەودالْ بوون و لەگەڵ گەلە مەیمونەکانی دیکە لەسەر لەوەڕی چاك دەجەنگین، بەڵام لەوەندەی کە ئاقارەکەی خۆیان بە خۆڕسك پێی دەبەخشین زیاتریان پیێ وەبەر نەدەهات و دەستەوەستان دەمانەوە، جگە لەوەی کە بە بێهۆشی و بەبیێ ئەوەی خۆیان مەبەستیان بێت، پاشەڕۆکەکانیان دەبوونە پەیین، بۆ ئەو ناوچەیەی کە تێدا دەگوزەران. کاتیێ کە سەراپا ئەو زەوییانە داگیرکران کە مەیمونەکان تێدا دەلەوەڕین، وای لێهات ژمارەیان زیادی نەدەکرد، یا لە چاکترین حاڵدا ژمارەیان بە سەقامگیری دەمایەوە. بەڵام هەموو گیانداریێك تا ئەوپەڕەکەی بۆژۆ   لە لەوەڕ ناکات و بە فیڕۆی دەدات، تەنانەت ئەگەر بەسەر هەرچ خۆراکێکی نۆیێ بکەویێ ئەوا لەناوی دەبا و بنەبڕی دەکات. گورگ، بە پێچەوانەی ڕاوچی، بزنەکێوی بۆ سالّی ئایندە ڕاناگریێ بۆئەوەی کاریلەیەکی بۆ بزیێ. ئەو بزنانەی نەمامەکانی گریکیان دەماشتەوە، هەموو شاخەکانی ئەم وڵاتەیان ڕووتاندەوە و کردیان بە زەوییەکی ڕووتەن. ئەم (ڕەوشتی بۆژۆ) نەکردنە لە نێو گیاندارانداا ڕۆڵێکی گرنگی لە گۆڕانی پلە بە پلەی ڕەگەزەکاندا هەیە، چونکە پاڵیان پێوەدەنێت، جگە لەوەی کە لەسەری ڕاهاتوون, لەسەر خۆراکێکی نوێش, خۆیان ڕابهێنن، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە خوێنەکانیان پێکهاتەیەکی کیمیایی جیاواز وەربگرێت و بەرەبەرە سەراپا پێکهاتەی لەشیان گۆڕانی بەسەردا بێت. بەڵام ڕەگەزە نەگۆڕەکان، ئەوانەی کە هیچیان تێدا ناگۆڕێت، لەناودەچن. بێگومان ئەم بۆژۆنەکردنە رۆڵێکی یەکجار مەزنی لە گۆڕانی پێشینەکانمان بەرەو مرۆڤ گێڕا، لەلای توخمە مەیمونێك کە لە هەموو توخمەکانی تر زیرەکتر و بەتواناتر بوون بۆئەوەیخۆیان بگونجێنن. ئەم نەریتی بۆژۆنەکردنە دەبوایە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە بەدی بهێنێت. ئەوانەش بریتین لەوەی کە، ئەو ڕووەکانەی خۆراکی ئەو توخمەی پێکدەهێنا، بەرە بەرە زیادیان دەکرد و ئەو جۆرەی کە بۆ خواردن دەشیا لە ڕووی ژمارە و قەوارەوە هەمیشە بەکاردەهات و دەبوایە جۆرە خۆراکێکی دیکە جێگای بگرێتەوە، واتە خۆراکیان هەردەم هەمەجۆرتر دەبوو، بەمەش ئەو پێکهاتەیەی دەچووە نێو دەزگا ئۆرگانیکەکانەوە جۆراوجۆر دەبوون، بەم جۆرەش تێکڕای مەرجە کیمیاییەکانی بوون بە مرۆڤ، ڕەخسین. بەڵام ئەمانە هەموو هێشتا کاری ڕاستەقینە نەبوون، چونکە کارکردن لە دروستکردنی کەرەستەکانەوە دەستپێدەکات. ئایا کۆنترین کەرەستە چین کە ئێمە بیاندۆزینەوە؟ واتە هەرە کۆنترینیان، بە پێی ئەو شتانەی کە بە میرات لەپاش مرۆڤی پێش مێژوو ماونەتەوە، هەروەها بە پێی شێوازی ژیانی یەکەمین گەلانی مێژوو، هەروەها بەپێی شێوازی ژیانی ئێستای سەرەتاییترین گەلانی دڕندە, کە

** دەربڕینێکە بۆ سەرەتاییترین پلەوپایەی ئەم بوارە، کە بەڕێز ولیام تۆمسۆن، لێکیداوەتەوە کە زۆر زیاتر لە سەدملیۆن ساڵ تێنەپەڕین، تا ئەوەی زەویی بە ئەندازەی ئەوە ساردبۆوە بۆئەوەی بۆ ژیانی درەخت و گیاندار لەبار بێت. ف. ئەنگڵس

†† بۆژۆ : گیا و ئالیکێکە کە لەبەردەمی ئاژەڵ و وڵاخا مابێتەوە —بڕوانە (فەرهەنگی خاڵ)— لێرەدا مەبەست لەوەیە کە وڵاخ و ئاژەڵ تا بۆی بکریێ دەلەوەڕیێ و هیچ لە پاش خۆی ناهێڵێتەوە. وەرگێڕی کوردی

دابین بکرێن؟ بێگومان کەرەستەی راووشکار و راوە ماسییە، ئەوەشمان لەبیرنەچێ کە ئەو کەرەستە سەرەتاییانە وەکوو چەکیش بەکار دەهێنران. بەڵام راووشکار و راوەماسی پێشتر خوازیاری ئەوەن کە مرۆڤ هاوکات و هاوشان لە گەڵ خۆراکی رووەك، چێژ لە گۆشتیش وەربگرێت، لێرەشدا جارێکی تر هەنگاوێکی زۆر گرنگ، بەرەو بوون بە مرۆڤ، بەدی دەکەین. **گۆشت** ئەو خۆراکە بنەڕەتیانەی بە ئامادەیی تێدایە کە ئۆرگانەکان پێویستیانە، بۆئەوەی لە خانەکانیاندا جۆری خۆراکەکە بگۆڕن، گۆشت ئەو ماوەیەی کورت کردەوە کە لەش بۆ هەرسکردنی رووەك پیویستی پێ بوو، هەروەها پێویستی بەو پرۆسانەی هەرسکردن نەبوو، کە رووەك لە جەستەی مرۆڤدا پێویستی پێ هەبوو، بەوەش خۆراکێکی بە بڕشتر و بە چێژتری هاتە دەست، بۆ چەسپاندنی ژیانێکی راستەقینەی گیانداریی. مرۆڤ لە رەوتی دروستبوونیدا هەرچەند خۆی لە رووەك دووردەخستەوە، بەو ئەندازەیەش خۆی بەسەر گیانداراندا سەر دەخست. هەروەك چۆن سەگ و پشیلەی کێویی هاوشان لەگەڵ خواردنی گۆشتدا خۆیان بە خواردنی رووەکیش راهێنا، ئەوەش بۆ خزمەتی مرۆڤ رایهێنان، هەر بەو جۆرەش خۆگونجاندنی مرۆڤ بۆ خواردنی گۆشت لەپاڵ خۆراکی رووەك، رۆڵێکی بنەڕەتیی هەبوو لە بەخشینی هێزێکی زیاتر بە جەستە و سەربەخۆیی لە ڕەوتی دروستبوونیدا. بەڵام کرۆکی هەرە گرنگ بریتیە لە کاریگەریی گۆشت بەسەر مێشکەوە، چونکە مێشك زۆر لەجاران پتر لە ئەو خۆراکانەی بۆ دەچوو کە بۆ پەرەئەستاندنی پێویستی پێی هەبوون، هەر بۆیە دواتر توانی، زۆر خێراتر و بەبێ کەموکوڕی نەوە پاش نەوە پەرە بستێنێت. ئەبێت بەڕێزانی گۆشتنەخۆر بمانبەخشن، چونکە مرۆڤ بە بێ خۆراکی گۆشت نەدەبوو بە مرۆڤ، جا ئەگەر خۆراکی گۆشت لە لای ئەو گەلانەی کە ئێمە دەیانناسین لە سەردەمێکدا ببێتە هۆی خواردنی خودی مرۆڤ، ئەوا ئەوە پەیوەندی بە ئێمەوە نییە کاتێك کە﴿ خەڵکی بەرلین و وێلاتاب و ویلز لە سەدەی دەیەمدا، دایك و باوکی خۆیان دەخوارد (3)﴾

خواردنی گۆشت، بوو بە بەردەبازێك، بۆ دوو هەنگاوی نوێی یەکالاکەرەوە بەرەو پێشەوە: بەکارهێنانی ئاگر و ماڵییکردنی گیانداران. هەنگاوی یەکەم، واتە (بەکارهێنانی ئاگر)، پرۆسەی هەرسکردنی کورترکردەوە، چونکە، ئەگەر بشێت بڵێین، خواردنێکی نیوە هەرسکراوی بە زار بەخشی. هەنگاوی دووەم، (ئاژەڵداری)، خۆراکی گۆشتی زیادکرد، چونکە هاوشان لەگەڵ راووشکاردا سەرچاوەیەکی نوێی و دەستەبەرکراوی بۆ مرۆڤ دابین کرد کە جگە لەوەش لە شیر و شیرەمەنیدا خۆراکێکی نوێی دەوڵەمەندی هاتە دەست کە لە رووی پێکهاتەوە بایەخی لە گۆشت کەمتر نییە. بەم جۆرە هەنگاوی یەکەم و دووەم بەشێوەیەکی راستەوخۆ_ بوون بە دوو کەرەستەی نوێی ئازادکرنی مرۆڤ، ئەگەر لە ورد و درشتی کاریگەریی ناراستەوخۆی ئەو دوو کەرەستەیە بکۆڵینەوە، وێڕای ئەوەی کە بۆ پەرەئەستاندنی مرۆڤ و کۆمەڵگا پڕ بایەخن، ئەوا لە بابەتەکە زۆر دوور دەکەوینەوە.

وەك چۆن مرۆڤ فێری ئەوە بوو، هەموو ئەو شتانە بخوا، کە بۆ خواردن دەشێن. به هەمان شێوەش، فێری ئەوە بوو، لە هەموو کەشوهەوایەکدا گوزەران بکات و بە هەموو لایەکدا بەسەر زەوییدا بلاوبووەوە کە بۆ نیشتەجێبوون بشێن، تاکە گیاندار بوو بتوانێت خۆبەخۆ ئەوانە بکات و ئەو دەسەڵاتەی هەبێت. گیاندارەکانی دیکە، کە خۆیان بۆ هەموو کەشوهەوایەك گونجاندووە، ئەوا خۆبەخۆ نەیانکردووە، بەڵکوو لە کاتێکدا فێری ئەوە بوون، کە بە دوای مرۆڤ دەکەوتن، ئەوانەش بریتین لە گیانداری ماڵی و مێش ومەگەز. گوێزانەوە لە گەرمەسێرەکانەوە، کە کۆنە زێدیان بوو، بەرەو کوێستانەکان، کە ساڵ بەسەر

گەرما و سەرمادا دابەش دەبێت، پێداویستیی نوێی هێنایە کایەوە وەك: داڵدە و پۆشاك، بۆ خۆپاراستن لە سەرماوسۆڵە و شێ، ئەمەش ڕێگای لەبەردەم چەندین بەشی تازەی کارکردن و چالاکییە نوێیەکان ئاوەڵاکردەوە، بە ئەندازەیەکی وەها، کە جار لەدوای جار زیاتر، مرۆڤی لە گیاندار دوور دەخستەوە.

بەهۆی هاوتایی کارەکانی دەست و مێشك و ئۆرگانەکانی قسەکردن، نەك تەنها لەلای تاکەکەسێك بەڵکو لە نێو کۆمەڵگاشدا، خەڵکیی، توانییان لە پرۆسەی جار لە جار ئاڵۆزتر بکارێن و هەمیشە بە ئەنجامی جار لە جار باڵاتر بگەن. ئەوە پاش ئەوە خودی کارکردن گۆڕانی بەسەرداهات و هەرجارە هەمەلایەنتر و بێ کەموکوڕتر دەبوو. ڕاووشکار و ئاژەڵداری وەرزێرییان هاتە پاڵ، وەرزێریش تەونکاریی و چنین و ئاسنگەریی و چینیسازیی و دەریاوانیی هاتە پاڵ. سەرئەنجام هونەر و زانست، هاوشان لەگەڵ بازرگانی و پیشەگەریدا سەری هەڵدا، لە هۆزەکانەوە گەل و دەوڵەت بەرپا بوو. یاسا و کاری رامیاریی پەرەیان دەستاند و لەگەڵیاندا ئەو ڕەنگدانەوە سەیروسەمەرەی شتە مرۆڤایەتییەکان لە مێشکی خودی مرۆڤدا: واتە ئایین. سەرجەم ئەو پێکهاتانەی، کە سەرئەنجام وەکوو بەرهەمی مێشك دەردەکەون و بەسەر کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا زاڵ دەبن و بەروبوومی کاری دەست دەخەنە پلەی دووەمەوە، ئەوەش بەو ئەندازەیەی کە ئەو مێشکەی تەنانەت لە سەردەمێکی زۆر زووی پەرەئەستاندنیدا (بۆ نمونە لە کاتی خێزانی سەرەتاییەوە)ڕا پلانی ئەو کارەی کە کێشاوێتی بە دەستێکی دیکە، جگە لە دەستی خۆی، جێبەجێ بکرێن. بەخشندەیی پەرەئەستاندنی بەلەزی شارستانێتی، بە دەسکەنەی پەرەئەستاندن و چالاکی مێشك لە قەڵەم درا. خەڵکی لەسەر ئەوە ڕاهاتن کە کردەوەکانیان لە بیریانەوە هەڵێنجن، لە بری ئەوەی کە لە پێداویستیەکانیانەوە هەڵیانهێنجن، ئەو کردەوانەی (کە بەبێ هیچ گومانێك لە کەللەیاندا ڕەنگ دەدەنەوە و هوشیاریان دەکەنەوە)، بەم جۆرە ئەم بۆچوونە ئایدیالیستییە لەمەڕ جیهان، لەگەڵ ڕۆژگاردا دروست بوو، هەر لەپاش هەرەسهێنانی جیهانی دێرینەوە، بەسەر مێشکدا زاڵ بوو. ئەم بۆچوونەش هێشتا بە ئەندازەیەك زاڵە، تۆێژەرەوە ماتریالیستەکانی سروشت کە سەر بە قوتابخانەی داروینن، نەیانتوانیوە بە بیروڕایەکی روون و ئاشکراوە بڕواننە چۆنێتی دروستبوونی مرۆڤ، چونکە ئەوان لە ژێر کارتێکردنی ئەو ئایدیۆلۆژیا ئایدیالیستیەوە، نەیانتوانی پەی بە ڕۆڵی کارکردن بەرن کە لەو پەرەئەستاندنەدا گێڕاوێتی.

وەك لەپێشدا ئەنگوستمان بۆ کێشا، گیانداران، مانەندی مرۆڤ، ئەگەر بە پێوانەیەکی کەمیش بێت، بەهۆی چالاکییەکانیانەوە گۆڕان بەسەر سروشتی دەرەوبەریان دەهێنن ، ئەو گۆڕانانەش کە لە دەوروبەری خۆیاندا بەرپای دەکەن، وەك بینیمان ، کار دەکەنەوە سەریان، چونکە لە سروشتدا هیچ شتێك بە تەریکی ڕوونادات و هەر لایەك کار دەکاتە سەر لایەکی تر و بە پێچەوانەشەوە، جا لەبەرئەوەی زانایانی سروشت زۆربەی کات ئەم بزاوتە هەمەلایەنە و ئەم کارلێکە ئاڵوگۆڕکراوە هەمەلایەن و گشتییە فەرامۆش دەکەن، هەر بۆیە ناتوانن بیرۆکەیەکی ڕوون و ئاشکرا لە مەڕ سادەترین شت پێکبهێنن. بینیمان کە چۆن بزنەکان ڕێگایان لە دووبارە چاندنەوەی گریك دەگرتن و لە دوڕگەی سانت–هیلانەدا ئەو بزن و بەرازانەی کە کەشتیوانە کۆنەکان بۆ دووڕگەکەیان دەهێنان، هەموو ڕووەکە کۆنەکانی ئەو ناوچەیەیان ماشتەوە، ئەمەش خاکی ناوچەکەی بۆ ئەو ڕووەکانەی کە کەشتیوانەکان و دانیشتوانی دیکە کە بۆ ئەوێیان هێنان، هەموار کرد. بەڵام ئەگەر ئەم گیاندارانە بە دووررودرێژی کار لە سروشتی دەوروبەریان بکەن، ئەوا ئەو کارلێکردنە لە بێ ئاگایی خۆیانەوە دێتە دی و بۆ خودی ئەم گیاندارانە دەبنە کوێرە ڕێکەوتێك. جا هەرچەند مرۆڤ خۆی لە دۆخی گیاندار دوور بخاتەوە، بەو ئەندازەیەش جێ دەستی لە سروشتدا سیمای

چالاكییەكی بە پلان و پەیڕەوكراو، كە ئەنجامی تایبەتی بخوازێت و پێشتر نەخشەی بۆ كێشرابێت بە خۆوە دەگرێت. گیاندار بەبێ ئەوەی كە بزانێ چی دەكات، درەختی ناوچەیەك بنەبڕ دەكات، بەڵام مرۆڤ ئەو درەختە لە ناو دەبات بۆئەوەی زەوییەكە بۆ تۆوكردن بسازێنێ، یا دار و بەرسیلەی تێدا دەچێنێت و دەزانێت لەكاتی درەو یا رنین چەندین جار لەوەی كە وەشاندوویەتی یا چاندوویەتی، پتری پێدەبڕێ. مرۆڤ درەختی سوودبەخش و گیانداریماڵی لە وڵاتێكەوە بۆ ئیدی دەبا ، بەمەش جیهانی گیانداران لە سەرجەمی كیشوەرێكدا رێكدەخا، لەوەش بەولاترەوە، موتوربەكردنی درەخت و گیاندار لە لایەن مرۆڤەوە، دەبێتە هۆی دروستبوونی گۆڕانكارییەكی ئەوتۆ كە ناسینەوەیان مەحاڵ بێت. ئەو درەختە كێوییانەی كە سەرچاوەی دەغڵودانە جۆربەجۆرەكانمانن، تاوەكوو ئێستا نادیارن. ئاخۆ سەگەكانمان بە هەموو جۆرەكانیانەوە، دەبێ لە چ گیاندارە كێوییەك كەوتبنەوە، یا خود هەر بەهەمان شێوە رەگوڕیشەی ئەو هەموو جۆرە مایینە رەسەنانەی كە هێشتا مشتومڕیان لەسەرە، لە كوێوە هاتوون.

ئاشكرایە، كە دەبێت بە راگوزەریش ئەوەمان بە بیردا تێنەپەڕێت، نكۆڵی ئەوەبكەین كە گیانداران بە شێوەیەكی پلاندارێژراو هەڵسوكەوت بكەن، بەڵكو بە پێچەوانەوە هەڵسوكەوتی بە پلان لە هەموو جێگایەكدا بەشێوەیەكی ئاولەمەیی هەیە كە پرۆتۆپلازم و پڕۆتینی زیندوو هەبێت و كاردانەوەشی هەبێت، واتە هەندێك جولانەوەی سووك و سانا كە لە ئەنجامی كاردانەوە بۆ وروژاندنێك كە لە دەوروبەرەكەیدا روودەدات. ئەم كاردانەوەیەش هەر دێتەدی، تەنانەت ئەگەر هێشتا خانە و نێرڤەخانەش[*] دروست نەبوبێت. ئەو شێوازەی كە تێدا ئەو

[*] بە ئەڵمانی (Nervenzelle) بە عەرەبی ( خلیە عصبیە) وەرگێڕی كوردی

رووەكانەی مێشومەگەز دەخۆن وەها نیشان دەدەن كە بە پلانێكی داڕێژراو نێچیرەكانیان راو بكەن، ئەگەرچی ئەو درەختانە بەتەواوی بە بێهۆشی خۆیان دەیكەن. لەنێو گیانداراندا توانای هەڵسوكەوتی هۆشمەندانە و پلان بۆداڕێژراو بە ئەندازەی پەرەئەستاندنی سیستەمی نێرڤەكان[*] پەرەدەستێنێت، لەلای شیردەرەكان دەگاتە ئاستێكی یەكجار باڵا. لە راوەرێوی بەریتانییەكان، مرۆڤ ئەوە بەزەقی دەبینێت، كە چۆن رێوییەكە بەتەواوی شارەزایی خۆی بۆ ئەو ناوچەیە بەكار دەهێنێت و چەند بەچاكی دەتوانێت كەڵك لە كەندولەندی ناوچەكە وەربگرێت و راوچییەكانی پێ هەڵەتە بكات. لەلای گیاندارە ماڵییەكان، كە هەڵسوكەوتیان لەگەڵ مرۆڤدا زۆر پێشی خستوون و ئەوەتا رۆژانە ئەو بلیمەتییەیان تێدا بەدی دەكرێت، كە بەتەوای دەگەنە ئاستی بلیمەتی منداڵان، هەروەك چۆن مێژووی پەرەئەستاندنی ئاولەمەی مرۆڤ لەپزدانی دایكیدا دووبارەبوونەوەیەكی كورتە بۆ مێژووی پەرەئەستاندنی جەستەیی گیاندارە پێشینەكانمان بە درێژایی ملیۆنەها ساڵ، لە كرمەوە را بگرە, بەهەمان شێوەش پەرەئەستاندنی بیری منداڵ بریتییە لە دووبارەبوونەوەیەكی كورت و چڕوپڕی پەرەئەستاندنی بیر لەلای ئەو پێشینانە، لانی كەم ئەوانەی دواییان بەڵام سەرجەمی چالاكی گیانداران كە بە پلانێكی داڕێژراو بوون، نەیانتوانی سروشت بە مۆركی ویست و ئارەزووی خۆیان بنەخشێنن، وەلێ مرۆڤ توانی.

بەم جۆرە بەكورتیی دەڵێین، گیاندار تەنها **سوود** لە سروشتی دەرەوەی خۆی وەردەگرێ و تەنها بەبوونی خۆی كاری تێدەكات، بەڵام مرۆڤ بەهۆی ئەو گۆڕانكارییانەی كە تێدا دەیانكات، تەنها بۆ خزمەتی مەبەستەكانی خۆی تەرخانی دەكات و **بەرزەفتی** دەبێت. ئەمەش دوا بەردی بناغەی جیاوازییە

[*] بە ئەڵمانی (Nervensystems) بە عەرەبی (الجهاز العصبی) وەرگێڕی كوردی

لەنێوان مرۆڤ و گیاندارەکانی دیکە، ئەم جیاوازیەش دیسانەوە کار هێنایە کایەوە(*).

بەڵام ئێمەی مرۆڤ نابێت، بەسەرکەوتنەکانمان بەسەر سروشتدا، زۆر لەخۆبایی ببین. چونکە هەر سەرکەوتنێك کە بەدەستی دەهێنین ، ئەوا تۆڵەمان لێدەکاتەوە. گومانی تێدا نییە کە هەرچ سەرکەوتنێك بەدەست بێت لە ڕیزی پێشەوەدا، ئەو ئاکامانەی تێدایە کە خۆمان لێکدانەوەمان بۆ کردووە، بەڵام لە ڕیزی دووەم و سێهەمدا ئاکامێکی زۆر جیاوازی دەبێت لەوەی کە ئێمە پێشتر لێکدانەوەمان بۆ نەکردبوو ، زۆربەی کات تەنها ئاکامەکانی پێشترمان بەبەردا دەدات. خەڵکی میزۆپۆتامیا و گریك و ئاسیای بچووك و جێگای تر بۆ هەموارکردنی کێڵگەکانیان، هەموو لێرەوارەکانیان بنەبڕ کرد، لەکاتێکدا کە هەرگیز لە خەونی ئەوەدا نەبوون کە ئەو کارەیان بەردی بناغەی ئەو قاتوقڕییەی بنیاد نا، کە ئێستا لەو وڵاتانەدا هەیە، چونکە ئەوان لەگەڵ بنەبڕکردنی ئەو لێرەوارانە کانگای شێ وتەڕی ناوچەکەیان چك کرد. ئیتالییەکانی چیای ئەلپ، کاتێ کە جەنگەڵی دارکاژەکانی باشووری ناوچەکەیان بڕییەوە، ئەو دارانەی کە لە بەشی باکووردا زۆر بەخزمەت بوون، هەرگیز نەیاندەزانی بەوە ئاژەڵداریی لەناوچەکەیان ریشەکێش دەکەن، لەوەش خراپتر ئەوە بوو کە نەیانزانی بۆ ماوەی هەرە زۆری ساڵەکەش کانیاوەکانیان چك کرد، جگە لەوەی کە ئەو داربڕینە بوو بەهۆی ئەوەی کە لە وەرزی باراندا، لێزمە و ئاوەڕۆی زۆر بەخوڕ بەسەر زەویدا دەڕژێت و پێزی ئەو خاکە دەبڕێ، هەروەها ئەوانەی کە لە

* نەخشاندوێتی (سەرنجی ئەنگلس)

ئەوروپا پەتاتەیان بڵاوکردەوە، درکیان بەوە نەکرد کە نەخۆشی زوخاو(*) لەگەڵ ئاردی ئەو پەتاتانە بڵاودەکەنەوە. بەم جۆرە لەگەڵ هەموو هەنگاوێکدا بیرمان دەخرێتەوە، کە ئێمە بەهیچ کلۆجێك بەسەر سروشتدا زاڵ نابین، هەروەك چۆن داگیرکەرێك میللەتێکی بێگانە داگیر دەکات، یا وەکو کەسێك کە لە دەرەوەی سروشتەوە هاتبێت، بەڵکو ئێمە، بە گۆشت و بە خوێن و بە مێشك هی سروشتین و لە ئامێزی داین، جا ئێمە جیا لە هەموو بوونەوەرێکی دیکە، بەوە بەرزەفتی دەبین کە دەتوانین یاساکانی بناسین و بەڕاست و ڕەوانی بەکاریان بهێنین.

جا لەڕاستیدا ئێمە ڕۆژانە فێری ئەوە دەبین کە بەشێوەیەکی ڕاستتر لە یاساکانی بگەین و کاردانەوە نزیك و دوورەکانی ئاکامی دەستێوەردانمان لە ڕەوتی ئاسایی سروشت درك پێ بکەین، جار لە جار زیاتر بۆمان دەلوێت، بەتایبەتی پاش ئەو هەنگاوە مەزنانەی کە زانستی سروشت لەم سەدەیەدا بەرەو پێشەوە نای، درك بە ئەنجامی دووری کاری ئاسایی ڕۆژانەمان بکەین، لانی کەم لە بواری بەرهەمهێناندا و فێری ئەوە ببین چۆنیان بەرزەفت ببین. هەرچەند زیاتر ئەمە ڕوودات، بەو ئەندازەیەش مرۆڤ لەگەڵ سروشتدا یەکانگیر دەبێت، نەك تەنها بە هەستپێکردن بەڵکو بە تێگەیشتنەوە، هەر بەو ئەندازەیەش ئەو بیروڕا گەلۆر و ناسروشتییە ئەگەری خۆی لەدەستدەدات کە دەڵێ ماتریال و روح، مرۆڤ و سروشت، هەست و گیان، لێکدژن. ئەو بیروڕایەی کە لە چاخی داهێزرانی سەردەمە کلاسیکیە کۆنەکەوە لە ئەوروپا سەری هەڵدا و لەسایەی کریستەکاندا گەیشتە چڵەپۆپەی پەرەئەستاندنی.

* زوخاو بریتیە لە زرینچکاوێك کە لە دەروونی مرۆڤ دێتە دەرەوە (بڕوانە فەرهەنگی خاڵ) (وەرگێڕی کوردی)

جا ئەگەر کارکردن بەدرێژایی هەزاران ساڵ خوازیاری ئەوەبوو کە ئێمە تاڕادەیەك فێری ئەوە بین پێشتر ئاکامە سروشتییە دوورەکانی کارە بەرهەمهێنەرەکانمان لێکبدەینەوە، بەڵام ئەمە هێشتا زۆر قورستربوو بەگوێرەی ناسینی ئاکامە کۆمەڵایەتییە دوورەکانی کارەکانمان. ئاماژەمان بۆ پەتاتە و ئاکامەکەی کرد، کە بڵاوبوونەوەی نەخۆشی زوخاو بوو. بەڵام زوخاو چییە لە چاو ئەنجامی قەتیسکردنی خۆراکی رەنجدەران بە پەتاتە وەکو یەکێك لە مەرجەکانی ژیانی کۆمەڵانی خەڵك لە تەواوی وڵاتاندا، یا دەبێت زوخاو چی بێت لەچاو ئەو برسێتییەی کە بەهۆی نەخۆشی پەتاتەوە ساڵی 1847 تووشی ئێرلەندە هات، یەك ملیۆن پەتاتەخۆری ئێرلەندی کە تەنها پەتاتەیان هەبوو بیخۆن، بەخاك سپێردران و دووملیۆنی تریش رووەو دەریا سەرگەردان بوون؟ کاتێك کە عەرەبەکان فێری دڵۆپاندنی ئەلکهول بوون بەخەویش نەیاندەزانی کە ئامرازێکی سەرەکییان داهێناوە و پاشان دەبێتە دەستەچیلەیەك بۆ لەناوبردنی دانیشتوانی بنەڕەتی ئەمەریکا، کە ئەوسا هێشتا نەدۆزرابونەوە. کاتێ کە کۆڵۆمبس ئەمەریکای دۆزییەوە نەیدەزانی بەم دۆزینەوەیەی، سەرلەنوێ کۆیلەتیی دەهێنێتە کایەوە، کە دەمێك بوو لە ئەوروپادا ئاسەواری بڕابوو، بەم کارەشی بناغەکانی کڕین و فرۆشتنی رەشپێستەکانی دامەزراندەوە. ئەو پیاوانەی لە سەدەکانی حەڤدە و هەژدەدا مەکینەی هەڵمیان داهێنا، ئەوەیان بەبیردا نەدەهات ئەو ئامرازەیان داهێناوە کە لە هەموو شتێك زیاتر بەشداری لە گۆڕانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی تێکڕای جیهان دەکات، گۆڕانێکی شۆڕشگێڕانە، بەتایبەتی لە ئەوروپادا، جگە لەوەی ئەوەش دەستەبەر دەکات کە سەروەت و سامان لەچنگ کەمایەسییەکدا پەنگ بخواتەوە و زۆربەی هەرە زۆری خەڵکیش بکات بە نەدار، لەپێشدا کۆنترۆڵی سیاسی و کۆمەڵایەتی بۆ بۆرژوا دەستەبەر دەکات، بەڵام پاشان خەباتێکی چینایەتی لە نێوان بۆرژوا و پرۆلیتاریا بەرپا دەکات و تەنها بە روخاندنی بۆرژوازییە، سەرجەم دژایەتییە چینایەتییەکان کۆتاییان پێ دێت. بەڵام لەم بوارەشدا پلە بە پلە بە رێگایەکی سەخت و دژوار و دوور و درێژدا و بەهۆی لێکدانەوە و توێژینەوە لە کەرەستەکانی مێژوو، فێری ئەوە دەبین کە ئاکامە راستەوخۆ و ئایندەکانی بەرهەمی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان درك پێ بکەین، بەمەش ئەگەری ئەوە بەدەست دەهێنین کە بەسەر ئەو ئاکامانەدا زاڵ بین و رێکیان بخەین.

بەڵام بۆ پراکتیزەکردنی ئەو رێکخستنە، پێویستیمان بە پتر لە شارەزاییەکی پەتی هەیە، لێرەدا دەبێت شێوازی تائێستای بەرهەمهێنان و سەرجەم سیستەمی ئێستای کۆمەڵایەتیمان بەتەواوی سەرەنگرێ بکەین. هەموو شێوازەکانی تا ئێستای بەرهەمهێنان ئامانجیان تەنها وەدستهێنانێکی راستەوخۆی قازانجی ئایندەی کار بووە. ئەنجامەکانی دیکە، کە پلە بە پلە بە هۆی دووبارەبوونەوە و کەڵەکەبوون دەهاتنەکایەوە، بەتەواوی بە پشتگوێخراوی دەمانەوە. لە دۆخی سەرەتاییدا، خاوەندارێتی هاوبەش لە زەویدا، لەلایەکەوە پێ بە پێی ئاستی پەرەئەستاندنی مرۆڤ بوو کە بە گشتی ئاسۆی لێکدانەوەی سنووردار بوو، لەلایەکی ترەوە بەرادەیەك زەوییەکی زیادی لەبەردەستدا بوو، کە لەو سەروبەندەدا، بۆ ئەو ئابوورییە سەرەتاییەی جەنگەڵستان، کەلێنێکی گەورەی بۆ ئاکامە خراپەکان هێشتبۆوە. جا کاتێك کە ئەم زەوییە زیادە بەکارهات، خاوەندارێتی گشتی هەرەسی هێنا. بەڵام هەموو شێوە باڵاکانی بەرهەمهێنان، خەڵکیی، بەسەر چینی جۆراوجۆر دابەش دەکەن، ئەوەش دەبێتە هۆی هاتنەکایەوەی دژایەتی لە نێوان چینە زاڵەکان و چینە چەوساوەکان، بەڵام بەرژەوەندی چینە زاڵەکە دەبێتە توخمێکی هاندەر بۆ بەرهەمهێنان. ئەویش بەو ئەندازەیەی کە تەنگ بە لانی کەمی پێداویستی بژێویی چەوساوەکان

هەڵنەچنێت. ئائەمەیە شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریی، کە ئێستا ئەورووپای رۆژئاوا پیادەی دەکات. هەر سەرمایەدارێك کە بەرهەمهێنان و ئاڵوویرکردنی لەژێردەستدایە، تەنها خەمی قازانج و کارەکانی خۆیەتی، خودی ئەو قازانجەش– بەو ئەندازەیەی مەبەست لە سوودوەرگرتن لەو کاڵایە کە بەرهەم دەهێنرێت یا ئاڵوگۆڕ دەکرێت – بەتەواوی دەچێتە ریزی دواوە، چونکە قازانجکردن لە فرۆشتندا، دەبێتە تەنها پاڵپێوەنەرێك.

زانستی کۆمەڵایەتی بۆرژوازی، ئابووریی رامیاریی کلاسیکی، لە بنجدا تەنها قسە لەو ئەنجامە کۆمەڵایەتییانە دەکەن کە ڕاستەوخۆ لە مەبەستی کارە مرۆڤایەتییەکانەوە بەرەو بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕکردن ئاڕاستە دەکرێن. ئەمەش بە بێ کەموکورتی بەسەر ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتییەدا دەگونجێت، کە ئەم زانستە بە شێوەیەکی تیۆری دەری دەبڕێت. کاتێك کە سەرمایەداران، بە مەبەستی قازانجی راستەوخۆ بەرهەم دەهێنن و ئاڵوگۆڕ دەکەن، لە پێش هەموو شتێکدا، تەنها نزیکترین ئەنجامی راستەوخۆ لەبەرچاو دەگرن. ئەگەر پیشەگەرێك یا بازرگانێك ئەو کاڵایەی کە بەرهەمهێنراوە یا کڕدراوە، بە قازانجێکی کەمیش بفرۆشێت، ئەوا ئەو بەو قازانجە قایلە و هەرگیز گوێ نە بە کاڵاکە و نە بە کڕیارەکەی دەدات. هەمان شت لەبارەی ئاکامە سروشتییەکانی هەمان کار. وەرزێرە ئیسپانییەکان لە کوبا، ئەوانەی لێرەوارِی سەر چیاکانیان سوتاند و سووتوەکەیان کرد بە پەیین، بۆ تەنها **یەك** نەوە لە درەختی قازانج بەخشی قاوە، گوێیان لەوە نەبوو کە دواتر بارانی پشتێنەیی, ئەو چینە خۆڵەی رامالّی، کە ناوچەکەی داپۆشیبوو و لە بەردی رووتەن بەولاوە هیچی تریان بۆ نەمایەوە! شێوازی ئێستای بەرهەمهێنان لە بەرامبەر سروشت و کۆمەڵگادا، تەنها نزیکترین دەسکەوتی بەرجەستەی لەبەرچاوە، پاشان مرۆڤ سەرسام دەبێت کاتێك کە ئاکامە دوورەکانی داهاتوو، کە لەو کارانەوە سەرچاوە دەگرن، زۆر جیاوازن و زۆربەشیان بەتەواوی لێکدژن، چونکە هاوسەنگی لە نێوان خواست(الطلب) و خستنەڕوودا(العرض) لە جەمسەرەکەیدا ئاوەژوو دەبنەوە، وەك چۆن خولی پیشەسازی دەساڵ جارێك ئەوەمان نیشان دەدات، وەك چۆن ئەڵمانیاش بەوە باری هێنا، لەکاتێکدا دەرگایەکی بچوکی ئەم جۆرە سەرنگرێبوونەی لەکاتی (نابووت) یدا بەڕوودا کرایەوە (4)، چونکە خاوەندارێتی تایبەت کە لەسەر کاری تاکەکەس چەق دەبەستێت، بەپێویست بەرەو نەهێشتنی خاوەندارێتی کرێکاران پەرەدەستێنێت، بەڵام سەرپاکی خاوەندارێتی جار لە جار زیاتر لەدەستی ئەوانەدا کۆدەبێتەوە، کە کرێکار نین، چونکە (...)*

*ئەم تۆژینەوەیە لە ساڵی 1876 دا ئەنگلس نووسیویەتی،*
*لە گۆڤاری (Neue Zeit) دا بۆ یەکەمین جار بڵاوکراوەتەوە.*

*1896 (Neue Zeit)*

*ئەم نووسراوە راستەوخۆ لە دەستنووسەکانی ( مارکس/ ئەنگڵس )ەوە وەرگیراوە، بەرگی 20 لاپەڕە 444–455*

* ئا ئەلێرەدا دەستنوسەکە دەپچڕێ. (سەرچاوە ئەڵمانییەکە)

## تێبینیەکان

ئەنگڵس لێکۆڵینەوەکەی (ڕۆڵی کارکرن لە گۆڕینی مەیمون بۆ مرۆڤ) لەکاتی خۆیدا وەکو پێشەکییەك بۆ کارێکی مەزن، بە ناوی (دەربارەی هەر سێ شێوە بنەڕەتییەکەی کۆیلەتی) نووسیوە، ( پاشان ئەنگڵس ئەو ناوەی بە (پێشەکی کۆیلەکردنی کارگەران) گۆڕییەوە، بەڵام ئەم کارەش بە تەواونەکراوی مایەوە. لە کۆتاییدا ئەنگڵس ئەو پێشەکییەی ناو نا (ڕۆڵی کارکردن لە گۆڕینی مەیمون بۆ مرۆڤ) کە بەشی هەرە زۆری دەستنووسەکەی گرتبۆوە. ئەم ناونیشانەش لە پێرستی بەشی دووەمی بابەتی (دیالێکتی سروشت) دایە، بڕوانە (کارەکان مارکس/ئەنگلس بەندی 20، لاپەڕە 269).

1. بڕوانە چارلس داروین (بنەچەی مرۆڤ و پالاّوتنی بە پێودانگی سێکس) بەشی 1، لەندەن 1871.
2. بە پێی تازەترین بۆدەرکەوتنەکان، پەیدابوونی ژیان بۆ یەکەمین جار لەسەر زەویی، لە 2 ملیار ساڵ زیاتری خایاندووە. کۆنترین شوێنەواری ناسراو، کە گیایەکی ئاوییە و تەمەنی دەگاتە 1.2 ملیار ساڵ.
3. لێرەدا ئەنگڵس مەبەستی لە گەواهەکانی قەشەی ئەڵمانی یاقوب گریم–ە لە کتێبەکەیدا (مافە دێرینەکانی ئەڵمانی) لاپەڕە 488 گوێتنگن 1828 (چاپی دووەم 1845).
4. مەبەست لە قەیرانی ئابووری جیهانە ساڵی 1873. لە ئەڵمانیادا ئەم قەیرانە لە مانگی 1873/05، بوو بە سەرەتای (نابووتییەکی مەزن) و قەیرانێکی درێژخایەن و تا کۆتایی حەفتاکان بەردەوام بوو.

## سوپاس و پێزانین

هەڵبەتە هیچ کارێك نییە بە تاکە کەسێك و بەبێ پشتگیری و دەستگیرۆیی کەسانی دیکە، ئەنجام بدرێت. لێرەدا زۆر سوپاسی هاوڕێیانی خۆشەویستم کاك سالار ڕەشید و کاك خەبات عەبدوڵا دەکەم کە بە دڵسۆزیی بە کارەکەدا چوونەوە و داکۆکییان کردم. هەروەها سوپاسی هەموو ئەندامانی خێزانەکەم دەکەم کە لەگەڵمدا شەونخونییان دەکرد.

وێنەی بەرگی دوایی ئەم کتێبە دەقاودەق لە چاپە ئەڵمانییەکەوە وەرگیراوە

# FRIEDRICH ENGELS

# Anteil der Arbeit an der Menschwerdung des Affen

